

نووسینی: کامەران کوردەوار و عادل صدیق

# قەزای گوڵعەنبەر (هەڵەبجە) لەساڵنامەکانی عوسمانیدا[1]

---

١ ئەم توێژینەوەیە پێشتر لە گۆڤاری زانکۆی هەڵەبجە، Volume 7, Issue 4, Desember 2022 بڵاوکراوەتەوە.

## پێشەکی

قەزای گوڵعەنبەر هەروەک لە بەڵگەنامە و تۆمارە ڕەسمییەکانی تری دەوڵەتی عوسمانیدا دەردەکەوێت، یەکێک بووە لە مەڵبەندە گرنگەکانی ئەو دەوڵەتە، هەڵکەوتەی جوگرافی قەزاکە و خاکەکەیی و ئەو خەڵکانەی لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون بەتایبەتی عەشیرەتی گەورەی جاف وایکردبوو کە ناوچەکە ببێتە جێگای بایەخی کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی و لە نزیکەوە بەووردی چاودێریی بکەن، بەتایبەت ئەگەر ئەوە بزانین ناوچەکە لە سێ لاوە هاوسنوور بووە لەگەڵ دەوڵەتی ئێران و هاوکات جێگای تیاگەڕانی گەورەترین عەشیرەتی کوردی ناوچەکەی ئەو ڕۆژگارە بووە، ناوچەکە و عەشیرەتەکەش هەمیشە مایەی چاوتێبڕینی ئێرانییەکان بوون و دەوڵەتی عوسمانیش هەموو تواناکانی خۆی خستبووە کار بۆ ئەوەی خاک و خەڵکەکەی لە بندەستی خۆیدا بهێڵێتەوە، ئەوە جگە لە بەپیتی خاکەکەیی و ئەو بەرهەمانەی کە لەم ناوچەیە بەرهەم هاتوون کە سەرچاوەیەکی گرنگی خۆراک و هاوکات باج بوون بۆ دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە گرنگی پێدان و لالێکردنەوەی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە شتێکی سرووشتی بووە و ڕەنگدانەوەی ناوچەکەش لە تۆمارە ڕەسمی و نا ڕەسمییەکانی ئەو دەوڵەتەدا بەرئەنجامی ئەو بایەخەیە کە ناوچەکە هەیبووە بۆ ئەو دەوڵەتە، لەو ڕوانگەوە لێکۆڵینەوە کردن لەسەر بابەتێکی لەم چەشنە سودبەخش دەبێ بۆ خوێنەران و لێکۆڵەرەوان.

## دەروازە

### ـ شوێنی هەڵەبجە لە گۆڕانکارییە کارگێڕییەکاندا

دوای ئەوەی عوسمانییەکان لەگەڵ سەفەوییەکان کەوتنە ململانێ لەسەر سنووری ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و چەند هەڵمەتێکیان بەو ئاڕاستەیە ئەنجامدا، توانییان لە ساڵی ١٥٥٢ -١٥٥٣ز ناوچەی شارەزوور، وەک دەرگایەک بۆ گەیشتن بە بەغدا و قەڵایەک بۆ پاراستنی سنوورەکانی ڕۆژهەڵات، دەستبەسەردا بگرن. لە دوای ئەوە عوسمانییەکان گرنگییەکی تایبەتیان بە ناوچەکە دا و قەڵای گوڵعەنبەر(خورماڵی ئێستا)یان بنیاتنایەوە و لە ڕێکخستنە کارگێڕییەکانی دەوڵەتەکەیاندا وەک ناوەندی

ئیالەتی شارەزوور دیارییان کرد، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات قەڵای گوڵعەنبەر، کە وەک بنکەیەکی گرنگی سەربازیی بوو بەرامبەر ئێران، گرنگی جارانی نەما و شاری کەرکوک وەک ناوەندی ئیالەتەکە جێگای گرتەوە(سەڵاح ، ٢٠١٧: ل ١٠٩ -١١٧ ؛ کۆچ، ٢٠٢٠: ل ٢٢ -٣٤). سلێمانیش هەتا ساڵی ١٨٥١ کە میرنشینی بابان بەیەکجاری کۆتایی هات، لەڕووی ئیدارییەوە سەنجەقێکی سەر بە ئەیالەتی شارەزوور بوو، بەڵام لەوە بەدوا سەنجەقی سلێمانی بەسترایەوە بە ئەیالەتی بەغداوە، لەگەڵ دروستبوونی ویلایەتی موسڵ(١٨٧٩)دا سەنجەقی سلێمانی لە بەغدا دابڕێنرا و خرایە سەر موسڵ، ئەم گۆڕانکارییەی کۆتایی هەتا ساڵی ١٩١٨ بەردەوام بوو(الحمیداوی، ٢٠٠٩: ص١٨٣).

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە، کە لە دوای ڕاگەیاندنی تەنزیماتەوە هەندێ گۆڕانکاری ئیداری لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا ئەنجامدرا، لە مانگی ئازاری ١٨٤٢دا پێکهاتەیەکی ئیداری نوێ ڕێکخرا، بەپێی ئەو ڕێکخستنە نوێیە لە چوارچێوەی سەنجەقدا کۆمەڵێک گوند بە گوندێکەوە دەبەسترانەوە و یەکەیەکی نوێیان بەناوی قەزا پێکدەهێنا و لەلایەن بەڕێوەبەری قەزاوە بەڕێوە دەبران، سەنجاقیش لەلایەن قائیمقامەوە بەڕێوە دەبرا. واتە ئەوەی کە ئیدارەی قەزاکانی دەکرد لەو قۆناغەدا بەڕێوەبەری قەزابوو نەک قائیمقام، ئەم شێوازە لە بەڕێوەبردنی قەزا لە ١٨٤٢وە هەتا ساڵی ١٨٦٤ بەردەوام بوو، لەم ڕێکەوتەوە دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی قەزا لە بەڕێوەبەرەوە گوازرایەوە بۆ قائیمقام لە پاڵ ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قەزادا.

دوای دروستبوونی لیوای سلێمانی(١٨٥٠ -١٨٥١)، هەریەک لە گوڵعەنبەر و هەڵەبجە سەرەتا بوون بە دوو قەزای سەربەخۆ لە لیوای سلێمانیدا پاشان لەچوارچێوەی یەک قەزا بەناوی گوڵعەنبەر، کە شارۆچکەی هەڵەبجە مەڵبەندەکەی بوو، بە لیواکەوە بەسترانەوە(سەڵاح ، ٢٠١٧: ل١١٠-١١١) و محەمەد پاشای جاف(١٨٦٩) کرایە یەکەمین قائیمقامی قەزاکە، دوای ئەم گۆڕانکارییە چیتر گوڵعەنبەری کۆن(خورماڵ) وەک یەکەیەکی کارگێڕی نەمایەوە هەتا هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەکە و سەرلەنوێ دروستکردنەوەی وەک ناوەندێکی کارگێڕی، بەڵام ئەمجارەیان بەناوی(خورماڵ)و وەک ناحیەیەکی سەر بە قەزای هەڵەبجە نەک قەزایەکی سەربەخۆ(عەلی، ٢٠٢٠: ل٤٩).

## بەشی یەکەم:
## هەڵکەوتەی جوگرافی قەزای گوڵعەنبەر و پێکهاتەی دانیشتوانەکەی

### باسی یەکەم/ جوگرافیا و ڕووی زەوی

بەپێی زانیاریی ساڵنامەکان ناوی(گوڵعەنبەر) لە لایەن سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە(١٥٢٠-١٥٦٦) بەسەر ئەم ناوچەیەدا بڕاوە و بایەخی تایبەتی بە ناوچەکە داوە و مزگەوتێکیشی لە شارۆچکەکە بنیاتناوە (ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣١٠). دوای ئەوەی لە سەدەی ١٩ گوڵعەنبەر وەک قەزایەک لە چوارچێوەی سەنجەقی سلێمانی دەرکەوتووە، هەڵکەوتە جوگرافییەکەی بەشێوەیەک بووە کە کەوتووەتە سەر سنووری ئێران(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣٠٨)، وەک قایمقامیەتێکی گەورە، ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی سلێمانی دەورە داوە، دێی ئەڵەبجە(هەڵەبجە)ش بووەتە ناوەندی کارگێڕیی قەزاکە(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢، ل ٣٣١ ؛ ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥، ل٢٢٩).

ساڵنامەکان ئەڵەبجە[١] بە لادێیەکی گەورە ناودەبەن کە هاوشێوەی شارۆچکەیەکە، بازاڕێکی قەیسەری(تاریکە بازاڕ)، دوکان و قاوەخانە، حەمامێک، چەند مزگەوتێک و قوتابخانەیەکی تێدایە. هەرچی گوندی گوڵعەنبەر(خورماڵ) ە، نزیک لە سنووری ئێرانە و سێ کاتژمێر لە ئەڵەبجەوە دوورە(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢، ل٣٣١). شەمسەدین سامی(١٨٩٥) سەبارەت بە قەزاکە دەڵێت:» گوڵعەنبەر قەزایەکی گەورەیە لەوپەڕی باکووری خۆرهەڵاتی لیوا و

---

١ شەمسەدین سامی لە بەشی پێنجەمی کتێبەکەیدا کە لە ساڵی ١٨٩٥ بڵاوکراوەتەوە سەبارەت بە قەزای گوڵعەنبەر دەڵێت: گوڵعەنبەر قەزایەکی گەورەیە لەوپەڕی باکووری خۆرهەڵاتی لیوا و ویلایەتە، لە لیوای سلێمانی و ویلایەتی موسڵ، لە خۆرئاواوە بە سلێمانی و قەزای شارەزوور(کەرکوک)، لە سێ لای دیکەشەوە بە سنووری ئێران دەورە دراوە. شارۆچکەی گوڵعەنبەر کە لەلایەن بەهەشتی سوڵتان سلێمان خانی قانونییەوە بنیادنراوە و ناوەکەی پێ بەخشراوە، لە سنووری ئێراندایە. دێی ئەڵەبچە(هەڵەبجە)، کە ناوەندی ئێستای قەزاکەیە، نزیکەی (٣٠٠٠) کەس دانیشتوان و شتی وەک مزگەوت و قوتابخانە و خان و بازاڕی هەیە و قەزا لە (٤٧٣) گوند پێکهاتووە، جگە لە خەڵکی نیشتەجێی تێگەڕانی عەشیرەتی (جاف)یشە. قایمقامی قەزاکە بەزۆری دەدرێتە سەرکردەکانی ئەم عەشیرەتە. قەزا شاخاوییە و بەروبوومەکەی دانەوێڵە و میوە و لە جۆرەکانی دیکەی هەیە. خەڵکی عەشیرەتەکە ئاژەڵێکی زۆر پێدەگەیەنن و لە خوریی و مووی ئەمانەش بەڕە و عەبا و هەندێک شمەکی دیکە دەچنرێ. (کورد و کوردستان لە یەکەم ئەنسیکلۆپیدیای تورکی مێژوودا، و.ئەحمەد تاقانە، چ١، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٢٦٨)

ویلایەتە، لە لیوای سلێمانی و ویلایەتی موسڵ، لە خۆرئاواوە بە سلێمانی و قەزای شارەزوور(کەرکوک) و لە سێ لای دیکەشەوە بە سنووری ئێران دەورە دراوە. شارۆچکەی گوڵعەنبەر کە لەلایەن سوڵتان سلێمانی قانونییەوە بنیادنراوە و ناوەکەی پێ بەخشراوە، لە سنووری ئێراندایە. دێی ئەڵەبچە(هەڵەبجە)، کە ناوەندی ئێستای قەزاکەیە، نزیکەی (٣٠٠٠) کەس دانیشتوان و شتی وەک مزگەوت و قوتابخانە و خان و بازاڕی هەیە و قەزاکە لە (٤٧٣) گوند پێکهاتووە، جگە لە خەڵکی نیشتەجێ، تێگەڕانی عەشیرەتی (جاف)یشە. قایمقامی قەزاکە بەزۆری دەدرێتە سەرکردەکانی ئەم عەشیرەتە. قەزاکە شاخاوییە و بەروبوومی دانەوێڵە و میوە و جۆرەکانی دیکەی هەیە. خەڵکی عەشیرەتەکە ئاژەڵێکی زۆر پێدەگەیەنن و لە خوریی و مووی ئەمانەش بەڕە و عابا و هەندێک شمەکی دیکە دەچنرێت«(سامی، ٢٠٠٨: ل٢٦٨).

هەرچەندە شارۆچکەی هەڵەبجە بیناگەلێکی[٢] سەرنجڕاکێشی تێدایە، بەڵام لە وەرزی هاویندا بەهۆی گەرم بوونی زۆر و وشکبوونی نزیکەی تەواوی ئاوەکەی، زۆربەی خەڵکەکەی ناچارن بەرەو گوندەکانی دەوروبەر بڕۆن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥، ل٢٢٩).

زەوییەکانی قەزاکە شاخاویین و لە هەموو لایەکییەوە چیای سەخت هەیە. لەناوەوەشدا چیا و گردی وەک(کونە سوچەڕ، سەربۆرە، کڵاوبزر، تاشلی و گڵەزەردە) زنجیرەیان بەستووە. زۆربەی ئەمانەش خاکێکی سانایان هەیە و بۆ کشتوکاڵ گونجاون. جگە لەوە، دەشتی بەرینی شارەزووریش زەوییەکی ئاسان و بەپیتە و بەگشتی زەوییەکانی قەزاکە بۆ کشتوکاڵ کردن گونجاون. لە زۆربەی لایەکانی قەزاکەدا سەرچاوەی هەڵقوڵاو و ڕووبارگەلی وەک ڕووبارە مامناوەندییەکانی(تانجەڕۆ و زەڵم) و ڕووبارە بچوکەکانی(قالیچۆ، مەوان، مالوان

---

٢ بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەو کۆشک و بینایانەی کە محەمەد پاشای جاف و کوڕ و کوڕەزاکانی لە هەڵەبجەدا دروستیانکردووە بڕوانە: تەئریخی جاف، لێکۆڵینەوەی د.حەسەن جاف، بەغدا، ٥٩٩١، ل٥٨١-٦٨١ ؛ عەبدولڕەقیب یوسف و عادل صدیق: بیرەوەرییەکانی حامی بەگی جاف، چ١، چاپخانەی تاران، ١٢٠٢، ل٩٢-٠٣ ؛ عبدالرقیب یوسف: فن العماره فی کردستان (قصر عثمان پاشا جاف فی حلبجة، القسم الاول، جریدة العراق، ٠٨٩١/٦/٨٢، القسم الثانی ٠٨٩١/٧/٣ ؛ میجرسون(میرزا غلام حسینی شیرازی): رحلة متنکر الی بلاد مابین النهرین وکردستان، ج١، ط١، بغداد، ٠٧٩١، ل٠٨٢ ؛ حەسەن فەهمی بەگی جاف: مێژووی هۆزی جاف و مەحمود پاشای جاف، چاپخانەی دێکان، ٩٩٩١، ل٤٤-٥٤.

و دەلێن) دەبینرێت، ئەمەش وایکردووە زەوییەکانی ناوچەکە، کە خۆیان توانای کشتوکاڵیی باشیان هەیە، زیاتر بەپیت و فەڕ تر بن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣٠٨).

ڕووباری تانجەرۆ، کە ڕووبارێکی مامناوەندە، لە سەرچناری ڕۆژئاواوە دێت و بە ناوەڕاستی دەشتی شارەزووردا تێپەڕ دەبێت، دوای ئەوەی چەند جۆگەیەکی بچووک دەگرێتەخۆ و چەند کەناڵێکیش ئاودێر دەکات، لە ناوچەی(دوو ئاوان) لەگەڵ ڕووباری(زەڵم)[٣] یەکدەگرێت و لە دەربەندیخان دەڕژێتە ڕووباری دیالەوە(سیروان). لەڕاستیدا ڕووبارەکە لەم ناوچەیەدا بە سیروان ناودەبرێت نەک دیالە. ڕوونتر بڵێین، ڕووباری سیروان لە سنووری پارێزگای سلێمانیدا هەر بە سیروان ناودەبرێت، دوای ئەوەی ڕووبارەکە دەچێتە سنووری پارێزگای دیالە(بعقوبە) بە ڕووباری دیالە دەناسرێت (علاءالدین، ٢٠٠٧: ل٩٣-٩٥).

هەرچی ڕووباری زەڵمە، لە گوندی زەڵمی(گوندەکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ناحیەی خورماڵی ئێستا بەدووری چەند کیلۆمەترێک - توێژەران) قەزاکەدا سەرچاوە دەگرێت و بە دەشتی شارەزووردا تێپەڕ دەبێت، زەڵم دوای لەخۆوەگرتنی چەند جۆگەیەک و ئاودێرکردنی چەند کەناڵێک، لە ناوچەی(دوو ئاوان) بە ڕووباری(تانجەرۆ) دەگات(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣٠٨-٣٠٩).

## باسی دووەم: پێکهاتەی دانیشتوان

دانیشتوانی قەزای گوڵعەنبەر بەگشتی بریتین لە هۆز و عەشیرەتە کوردییەکان، لەپاڵیاندا تیرەیەکی بچووکی عەرەب بەناوی(شەمێران) و ژمارەیەکی کەمی جوولەکە لە گوندەکان هەن. دانیشتوی گوندەکان بەگشتی نیشتەجێن و بە کشتوکاڵەوە سەرقاڵن، بەڵام خەڵکی ناوەندی قەزا، کە زۆربەیان جافن[٤]، لەگەڵ شەمێرانەییەکانیش، نیشتەجێ نین و بە ئاژەڵدارییەوە خەریکن، واتە گەرمیان و

---

٣ گوندی زەڵم دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ناحیەی خورماڵ، بەدووری چەند کیلۆمەترێت. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (عطا محمد علاءالدین: م.س، ل٥٩)

٤ نزیکەی تەواوی خەڵکی ئەم قەزایە، هەروەک ئەدمۆنز ئاماژەی بۆ کردووە (تاپۆی) بنەماڵەی حاکمەکان(بەگزادەکانی جاف) بووە، جافەکان بەلایەنی کەمەوە سێ لەسەر چواری ڕێژەی دانیشتوانی ئەم قەزایەیان پێکدەهێنا. (کورد تورک عەرەب، و.حامید گەوهەری، چ٢، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٢٨١)

کوێستان دەکەن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣٠٩ -٣١٠).

ئەوەی مایەی تێڕامانە ساڵنامەکە شەمێرانەییەکانی وەک خەڵکێکی عەرەب ناساندووە، لەڕاستیدا ناوچەی شەمێران کەوتووەتە ڕۆژئاوای شاری هەڵەبجەی ئێستا و قەزای گوڵعەنبەری کۆنەوە، لەسەر دەریاچەی دەربەندیخان هەڵکەوتووە، نزیکەی دوازدە گوند لەخۆدەگرێت، چەند گوندێکیشیان دوای دروستکردنی بەنداوی دەربەندیخان، بوون بەژێر ئاوی دەریاچەکەوە، ناوچەکە تەواو کوردنشینە و نەبیستراوە لە کۆندا عەرەبی لێ بووبێت، ئەوەندە هەیە یەکێک لە گوندەکانی ناوچەکە ناوی (عارەوان) بووە و یەکێکیشە لە گوندە ژێرئاوکەوتووەکان. دانیشتووانی ئەم ناوچەیە بەتەواوی جافن و پێشتر بە یەزدانبەخشی ناسرابوون، بەڵام لە ئێستادا ناوی ناوچەکە بووە بە ناسنامەیان و یەزدانبەخشییەکە کەمتر بەکاردێت، (عەلی، ٢٠١٤: ل١٦-٥٦) کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف سەبارەت بە یەزدانبەخشییەکان دەڵێت:» طایفەیەکی گەورەن لەناو جافدا و، دەبن بە سێ کۆمەڵ: خاڵە، بەگزادە و مامەشەیی. بەشی خاڵە بە یەزدانبەخشی ناودەبرێن. بەگشتی ئەم سێ کۆمەڵە حەوتسەد ماڵ دەبن، ئەمانیش وەکو نەورۆڵی، هەتاوەکو سی ساڵ لەمەوبەر گەڕیاو بوون، ئێستە(١٩٣٣) لە شەمێران فەلاحەت و کشتوکاڵ ئەکەن.... کە کەوتووەتە باشووری قەزای ئەڵەبجەوە.... جێگایەکی زۆر باش و قایم و هەوا خۆشیان هەیە و شاخی زمناکۆیان بەدەستەوەیە، کە جێگەیەکی زۆر سەخت و گرنگە. ئەمان بەگشتی چوارسەد پیادە و سەد سواریان هەبووە، هەمیشە گەورەکانی جاف وەکو محەمەد پاشا و قادربەگ و سلێمان بەگ کوڕانی کەیخەسرەو بەگ ئەم طایفەیان بۆ ئیسنادگای خۆیان لە سنووری ئێران و باباندا داناوە«(فەتاح بەگی جاف، ١٩٩٥: ل١٣٩-١٤٠)، لەبەرئەوەی عوسمان پاشای سەرۆکی گشتی عەشیرەتی جاف وەک قایمقامی گوڵعەنبەر لەلایەن حکومەتەوە دامەزراوە، عەشیرەتەکە بەو قەزایەوە پەیوەستن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢، ل٣٣١) و زۆرینەیان تێیدا دەژین و سێ وەرزی ساڵ لە سنووری قەزاکەدا دێن و دەچن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥، ل ٢٢٩). لەڕاستیدا هەر لەدوای ساڵی ١٨٦٩وە کە محەمەد پاشای جاف کرا بە قائیمقامی هەڵەبجە، ژمارەیەکی زۆر لە بەگزادەکانی جاف و خەڵکانی تری سەر بەو عەشیرەتە لە هەڵەبجەدا گیرسانەوە و نیشتەجێ بوون، واتە پەیوەستبوونی عەشیرەتی جاف بە هەڵەبجەوە بۆ سەردەمی محەمەد پاشا دەگەڕێتەوە نەک عوسمان پاشای کوڕی.

جافەكان كە گەورەترین عەشیرەتن لە سنووری سەنجەقی سلێمانی(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل ٢٢٤)، لە دەشتی شارەزوورەوە تا قەزای سەلاحیە(كفری) ی سەر بە كەركوك بڵاوبوونەتەوە(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل ٣٠٩) و لە چەندین لق پێكدێن، كە دیارترینیان:" میكائیلیی، شاتریی، ڕۆغزادیی، گەلاڵی، هارونی، نەورۆڵی، سەدانی، یەزدانبەخشی، عەمەڵە و پشتماڵە"(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢، ل٣٣١). هەر تیرەیەك لەو تیرانە سەرۆكی تایبەتی خۆی هەیە كە نازناوی(كوخە/ كوێخا)یان هەیە و لە پیاوماقوڵانی عەشیرەتەكەن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥، ل٢٢٩). سەرۆكی گشتیی عەشیرەتەكەش عوسمان بەگی محەمەد پاشازادەیە كە لەلایەن حكومەتەوە دامەزراوە، هەروەك براكانیشی سلێمان بەگ و محەمەدعەلی بەگ لە پیاوماقوڵانن. (ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل ٢٢٧ –٢٢٨)

ساڵنامەكە تەنها ناوی ئەو دوو برای عوسمان پاشای هێناوە، لەڕاستیدا محەمەد پاشا حەوت كوڕی هەبووە، ئەوانیش بریتی بوون لە: مەحمود پاشا، عوسمان پاشا، محەمەدعەلی بەگ، سلێمان بەگ، حەسەن بەگ، قادر بەگ و فەتاح بەگ. مەحمود پاشا دیارترینیانە و لە هەموویان گەورەتر بووە و دوای هەمووشیان كۆچی دوایی كردووە. (فەهمی جاف، ١٩٩٩: ل٥٢).

جافەكان بەگشتی لەسەر مەزهەبی شافیعین و بە زمانی كوردی دەدوێن. یەك لە سەدو پەنجا كەسیان خوێندەوارن و یەك لە هەزاریشیان دەزانن بە فارسی بنووسن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢، ل٣٣٢). هەندێكیان بە جۆرێك نەزانن كە ناتوانن چاكە و خراپە لێكجیا بكەنەوە، ئارەزووی ئەوەیان هەیە ماڵ و سامانی یەكتری تالان بكەن، ئازاترین و چەكدارترین تیرەشیان ڕۆغزادییە(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل٢٢٨). جێگای ئاماژەپێدانە كە ئەم سرووشتی شەڕانگێزیی و بڕندەییەی كوردەكان لە بەڵگەنامە عوسمانییەكاندا بەتەواوی ڕەنگیداوەتەوە و زۆرینەی عەشیرەتە كۆچەرییە كوردەكان بەهەمان خەسڵەت وەسف كراون. جافەكانیش وەك هاوبەشێكی ئەم خەسڵەتە كوردەوارییە، زۆرجار لەسەر شتی بچووكیش بووبێت شەڕ و كوشتاری گەورەیان ناوەتەوە. بۆ نمونە بەڵگەنامەیەكی عوسمانی كە دەگەڕێتەوە بۆ(٢٣ جمادی الاول ١٢٧٢ / ٣١ كانونی دووەمی ١٨٥٦) ئاماژە بەوە دەكات كە هەردوو تیرەی ڕۆغزادیی و شاتریی جاف لەسەر

شووتییەک دوژمنایەتییان نوێ بووەتەوە و چەند کەسێک لە نێوانیاندا کوژراوە و بریندار بووە(A_}MKT_UM_00249_00038_001_001).

بەپێی ساڵنامەی(١٣١٠ک/١٨٩٢ز)ی ویلایەتی موسڵ، ژمارەی ماڵەکانی هەر یەکێک لە تیرەکانی عەشیرەتی جاف بەم شێوەی خوارەوەیە(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل٢٢٧):

| ژمارەی ماڵ | ناوی تیرە |
|---|---|
| ١,٤٠٠ | میکائیلیی(تاقمی ڕەش و بۆریش لەگەڵ ئەمانەن) |
| ١,٣٠٠ | پشتماڵە |
| ١,١٠٠ | شاتریی |
| ٧٠٠ | یەزدانبەخشیی |
| ٥٠٠ | ڕۆغزادیی |
| ٥٠٠ | گەڵاڵیی |
| ٤٠٠ | عەمەڵە |
| ٤٠٠ | سەدانی |
| ٣٠٠ | نەورۆڵی |
| ٢٥٠ | هاروونی |
| ٦٨٥٠ ماڵ | سەرجەم |

هەر بەپێی هەمان سەرچاوە، جگە لەو ماڵانەی لە خشتەکەی سەرەوەدا تۆمارکراون، ١٢٠٠ ماڵی دیکەی جاف تۆمارنەکراون، کە ماوەیەکی زۆرە وازیان لە ژیانی کۆچەریی هێناوە و لە ڕێگای کشتوکاڵەوە دەژین و لە گوندەکانی کەنار ڕووبارەکانی زرباتییە و دیالە نیشتەجێن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل٢٢٦). بەمەش کۆی گشتی ماڵەکانی عەشیرەتی جاف دەبێتە (٨٠٥٠) ماڵ. ئەم ژمارەیەش، بەنزیکەیی لە چەندین بەڵگەنامەی عوسمانی پشتڕاست کراوەتەوە، بۆ نمونە بەڵگەنامەیەک کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی(١٢٧٩ک/١٨٦٢ز) باس لەوە دەکات کە ژمارەی ماڵەکانی عەشیرەتی جاف لە نێوان (٨–١٠) هەزار دەبێت (I_DH_00499_033949_003_001).

بەهۆی ئەوەی لەلایەکەوە لە سەردەمی عوسمانیدا داتایەکی ورد و تەواو بۆ ژمارەی دانیشتوان نەبووە، لەلایەکی تریشەوە ئەو داتایانەی دانیشتوان کە هەن زۆرینەیان بریتین لە ژمارەی ماڵ و سەرۆک خێزانەکان یان ڕەگەزی نێر بەتەنها، ناچارین وەک ڕێگاچارەیەکی ئەکادیمی بۆ دۆزینەوەی ژمارەی گشتیی خەملێنراوی دانیشتوان پەنا ببەینە بەر سیستەمی قاتەژمارە، کە بریتییە لە چەند قات کردنەوەی ژمارەی تۆمارکراو لە سەرچاوەکاندا. توێژەرانی ئەو بوارەش ڕاوبۆچوونی جیاوازیان لەسەری هەیە لە نێوان قاتەژمارەی(٣,٥ تا ٨). ڕەنگە باشترینیان قاتەژمارەی مێژوونووسی تورکیا (پرۆفیسۆر عومەر لوتفی بارکان) بێت کە قاتەژمارەی پێنجی هەڵبژاردووە(Abdulrazaq, 2021: s. 87-88 ) بەپشتبەستن بەوە (٨٠٥٠) ماڵەکەی جاف جارانی پێنج دەکەین، واتە گریمانەی ئەوە دەکەین کە هەر ماڵێک لە پێنج کەس پێکهاتبێت، بەمەش بۆمان دەردەکەوێت کە ژمارەی خەملێنراوی ئەندامانی عەشیرەتی جاف بریتیە لە (٤٠٢٥٠) کەس دانیشتوانی سەرەکی قەزای گوڵعەنبەر بوون.

بەگوێرەی ساڵنامەی(١٣٣٠ک/١٩١٢ز)ی ویلایەتی موسڵ، ژمارەی ئەو کەسانەی لە قەزای گوڵعەنبەر لە پەڕاوی تۆمار تۆمارکراون (٧,٧٨٢ مسوڵمان/ نێر ، ١٢٩ جوولەکە/نێر)ن، واتە کۆی گشتی تۆمارکراوان (٧,٩١١ نێر) ە(Cengiz Eroğlu vd. Kasım 2012, s. 43.). ئەگەر هەمان قاتەژمارەی سەرەوە وەربگرین، دەبینین ژمارەی دانیشتوانی قەزای گوڵعەنبەر (٣٩,٥٥٥) کەس دەردەچێت. ئەم ژمارەیەش تەنها خەملاندنی ئەوانەیە تۆمارکراون. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی هەردوو ساڵنامەی (١٣٠٨ک/١٨٩١ز) و (١٣١٠ک/١٨٩٢ز)ی ویلایەتی موسڵ لەکاتی خستنەڕووی ژمارەی دانیشتوانی شاری موسڵ ئەو ڕاستییە دووپات دەکەنەوە، کە ژمارەی ئەوانەی نیشتەجێ نین و تۆمارنەکراون زۆر زیاترە لەوانەی تۆمارکراون(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٠٨، ل ٩٦ ؛ ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل١٣٧)، دەتوانین بڵێین بۆ خەملاندنێکی گشتگیر پێویستە ئەو ژمارەیە(٣٩,٥٥٥) دوو هێندە بکرێتەوە، بەمەش دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ژمارەی دانیشتوانی قەزاکە لەوە زیاترە.

قەزای گوڵعەنبەر جگە لە ناوەندی قەزا، دوو ناحیەشی بەسەرەوەیە کە بریتین لە قزڵجە و سرۆچک[٥]. شارۆچکەی پێنجوێن ناوەندی کارگێڕیی ناحیەی قزڵجەیە و (٤٠٠) ماڵی تێدایە. شارۆچکەکە باخ و باخچە، بازاڕێکی نایاب، حەمامێک، دوو چایخانە، دوو خان، پێنج شەش مزگەوت و نوێژگە لەخۆدەگرێت. هەرچی ناحیەی سرۆچکە، هەرچەندە لە ئاست قزڵجەش نەبێت، بەڵام(بەپێی ساڵنامەی ١٣٢٥ک/١٩٠٧ز ویلایەتی موسڵ) (٣٠-٤٠) گوندی هەیە و خەڵکەکەی بە جووتیاریی و کشتوکاڵەوە سەرقاڵن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥، ل٢٣٠). بەپشت بەستن بە ساڵنامەی (١٣٣٠ک/١٩١٢ز)ی ویلایەتی موسڵ ژمارەی گوندەکانی ناوەندی قەزای گوڵعەنبەر و دوو ناحیەکەی بەم شێوەی خوارەوەیە(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣١٠):

| یەکەی کارگێڕیی | ژمارەی گوند |
|---|---|
| ناوەندی گوڵعەنبەر | ١١٣ |
| ناحیەی قزڵجە | ٩٠ |
| ناحیەی سرۆچک | ١٠٦ |
| سەرجەم: ٢ ناحیە ، ٣٠٩ گوند | |

لەکاتێکدا سەرجەم ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵ و ساڵنامەی(١٢٩٢ک/١٨٧٥ز)ی ویلایەتی بەغدا ئەوە دووپات دەکەنەوە کە قەزای گوڵعەنبەر تەنها هەردوو ناحیەی قزڵجە و سرۆچکی بەسەرەوەیە، وەک بابەتێکی جێ تێڕامان، ئەو ساڵنامە ناوەندییانەی لە ئیستەنبوڵەوە دەرچوون(ساڵنامەی دەوڵەتی عەلییەی عوسمانی) خشتەیەکی دیکەیان بۆ قەزاکە خستووەتەڕوو، بەگوێرەی ئەوە (قەرەداغ) بە ١٧٣ گوند و شێخ ئیسماعیل تائیفەسی بە (١) گوندەوە بە دوو ناحیەی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر هەژمارکراون(سالنامە دولت علیە عثمانیە

---

٥ هەتا ساڵی ٩١٩١ گوندی گێڵدەرە ناوەندی ناحیەی سرۆچک بووە، دوای ڕووخانی حکومەتی یەکەمی شێخ مەحمود، ئەوڕەحمان ئاغای برای ڕەزابەگ کرا بە بەڕێوەبەری ناحیەکە و ناوەندی ناحیەکەش لە گێڵدەرەوە گوازرایەوە بۆ بەرزنجە. (محەمەد ڕەسوڵ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب٢، لەندەن، ١٩٩١، ل١٤١)

١٣٠٨: ل٤٦٩ ؛ ١٣٠٩: ل ٤٩٥ ؛ ١٣٠٦: ل٤٥٨).

سالنامەکان ئاماژەیان بەوە نەکردووە کە ناوەندی ناحیەی‌تاقمی شێخ ئیسماعیل(شیخ اسماعیل تائیفەسی) کوێ بووە و لە ئێستاشدا ناحیەیەک بەو ناوەوە بوونی نیە، ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە شێخ ئیسماعیلییەکان یەکێک بوون لە تایفە گەورەکانی عەشیرەتی جاف، بەشە گەورەکەیان لە ئێران بووە و بەشە بچووکەکەشیان لە باشووری کوردستانی ئەمڕۆدا نیشتەجێ ببوون، ئەوانەی باشووریش دابەش ببوون بۆ شێخ ئیسماعیلی سوورەجۆ و شێخ ئیسماعیلی بنەجووت، بەشی بنەجووتیان لە سنووری قەزا گوڵعەنبەر لە ژمارەیەک گوندی وەک(گرێزە، بنگرد، سەراو، شانەدەر، قاڵیچۆ، مووان، بنەجووت و باڵانتەران) نیشتەجێ ببوون. (فەتاح بەگی جاف، ١٩٩٥: ل١٤٠-١٤١)

## بەشی دووەم/ بارودۆخی ئابووریی و کارگێڕی قەزای گوڵعەنبەر

### باسی یەکەم/ ئاژەڵداریی و کشتوکاڵ (ئابووری)

وەک لەسەرەوە ئاماژەی پێدرا، بەشێکی کەمی عەشیرەتی جاف، کە پێکهێنەری سەرەکی دانیشتوانی قەزای گوڵعەنبەر بوون، نیشتەجێ بوون، ئەوەی تر کە زۆرینەی عەشیرەتەکەیان پێکهێناوە، بە بەخێوکردنی مەڕوماڵات و ژیانی کۆچەرییەوە سەرقاڵ بوون(سالنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥، ل٢٣٠). بۆ دابینکردنی پژێوی خۆیان لە زستاندا، کەمێک کشتوکاڵیان لە گوندەکانیش کردووە(سالنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣٠٩). بەهەمان شێوە تیرەی شەمێرانەیی(یەزدانبەخشی)یەکانیش ڕەشماڵنشین بوون و لە کەنار ڕووباری دیالە[٦] خەریکی بەخێوکردنی ئاژەڵ بوون، بەتایبەتیی گامێش(سالنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣١٠).

بەپێی زانیاریی سالنامەکان، جافە کۆچەرییەکان لە وەرزی زستاندا لە ناوچەکانی(شێروان، سورخەلیل و کوڵەجۆ) ڕەشماڵیان هەڵداوە. لە وەرزی بەهاریشدا دەستیان بە جوڵە کردووە و لە دەشتی پان و بەرینی شارەزوور

---

٦ لێرەشدا دیسان بە دیالە ناوی هێناوە، پێشتر ڕوونمانکردەوە کە ڕووبارەکە هەتا سنووری سلێمانی ئەمڕۆ و لیوای سلێمانی کۆن تێدەپەڕێنێت هەر بە سیروان ناسراوە، کە دەگاتە سنووری پارێزگای دیالە(بەعقوبە) ئەنجا بە ڕووباری دیلە ناو دەبرێت. (توێژەران)

ماونەتەوە. پێش هاتنی وەرزی هاوینیش چوونەتە لەوەڕگاکانیان لە ناوچەی (قیزانیە و مەریوان) لە سنووری عوسمانیدا، تاوەکو ماوەی سێ مانگ لەوێ ماونەتەوە و پاشان گەڕاونەتەوە(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢، ل٣٣٢ ؛ ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل٢٢٨).

ساڵنامەکە (قیزانییە و مەریوانی)[٧] بە هەڵە وەک دوو ناوچەی سنووری قەڵەمڕەوی عوسمانی دیاریکردووە، لەڕاستیدا ئەو دوو ناوچەیە کەوتبوونە ناو سنووری دەوڵەتی ئێرانەوە. سەبارەت بە شوێنی کۆچ و باری عەشیرەتی جاف محەمەد سەعید جاف دەڵێت:» هەموو دەشتی شارەزوور موڵکی میرەکانی (بەگزادەکانی) جاف بووە، جاف هەر لە دەشتی (کۆکزی) سەر بە (قەرەتەپە) تا نزیکی شاری(بیجار) لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەر زەوی و موڵکێک کە لە ڕێگەی کۆچ و ڕەویاندا بووە، میرەکانی جاف بە نرخێک لە خاوەنەکانیان دەکڕی، ئەوەشیان بۆ ئەوە دەکرد، کە هۆزی جاف لەسەر لەوەڕ و پاوان لەگەڵ خەڵکدا گرفتاری شەڕ و ئاژاوە نەبن». (سەعید جاف، ١٩٩٤: ل١٤-١٥)

ساڵنامەی(١٣١٠ک/١٨٩٢ز)ی ویلایەتی موسڵ، زانیاریی زۆر گرنگی بۆ پاراستووین دەربارەی سامانی ئاژەڵی بەشێک لە تیرەکانی عەشیرەتی جاف، کە بەشێوەی خشتەیەک ژمارەی مەڕوماڵات و ئاژەڵەکانی سەرجەم تیرەکانی خستووەتەڕوو، بەم شێوەی خوارەوە(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل٢٢٧):

---

٧ ئەم دوو ناوچەیە کەوتوونەتە ناو سنووری دەوڵەتی ئێرانەوە نەک عوسمانی، سەبارەت بە شوێنی کۆچ و باری عەشیرەتی جاف محەمەد سەعید جاف دەڵێت: هەموو دەشتی شارەزوور موڵکی میرەکانی (بەگزادەکانی) جاف بووە ، جاف هەر لە دەشتی (کۆکزی) سەر بە (قەرەتەپە) تا نزیکی شاری(بیجار) لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەر زەوی و موڵکێک کە لە ڕێگەی کۆچ و ڕەویاندا بووە، میرەکانی جاف بە نرخێک لە خاوەنەکانیان دەکڕی، ئەوەشیان بۆ ئەوە دەکرد، کە هۆزی جاف لەسەر (لەوەڕ و پاوان) لەگەڵ خەڵکدا گرفتاری شەڕ و ئاژاوە نەبن. (هەڵوێستێکی جوامێرانە، گۆڤاری (ڕەنگین)، ژ (٨٦)، ٤٩٩١، ل٤١-٥١)

| ناوی تیره | سەر مەڕ و بزن | سەر گا، مانگا، گوێرەکە، گامێش، ئێستر، کەر |
| --- | --- | --- |
| میکائیلیی(تاقمی ڕەش و بۆریش لەگەڵ ئەمانەن) | ٧٢,٠٠٠ | ١٤,٠٠٠ |
| شاتریی | ٤٢,٠٠٠ | ١٠,٠٠٠ |
| ڕۆغزادیی | ٣٠,٠٠٠ | ٥,٠٠٠ |
| گەلالی | ١٨,٠٠٠ | ٣,٧٠٠ |
| هاروونی | ١٢,٠٠٠ | ٢,٢٠٠ |
| نەورۆڵی | ١٤,٠٠٠ | ٣,٠٠٠ |
| سەدانی | ١٨,٠٠٠ | ٥,٠٠٠ |
| یەزدانبەخشی | ٢٣,٠٠٠ | ٢,٧٠٠ |
| عەمەڵە | ٢٠,٠٠٠ | ٤,٠٠٠ |
| پشتماڵە | ٣٠,٠٠٠ | ٨,٠٠٠ |
| سەرجەم | ٢٧٩,٠٠٠ | ٥٧,٦٠٠ |

وەک لە خشتەکەی سەرەوە دەردەکەوێت، عەشیرەتی جاف خاوەنی (٢٧٩,٠٠٠) سەر مەڕ و بزن و (٥٧,٦٠٠) سەر مانگا و گوێرەکە و ئاژەڵی باربەر و هی تر بوون. بوونی ئەو ژمارە زۆرەی مەڕوماڵات وایکردووە سوودێکی زۆر لە بەروبوومەکانی ببینن و ساڵانە ژمارەیەکی یەکجار زۆری مەڕوماڵات و ئاژەڵی باربەر بفرۆشنە دەرەوە، هەربۆیە سەرچاوەکە دەڵێت:»بەگشتی تاکەکانی عەشیرەتەکە خۆشگوزەرانن و هەژار و نەدار لەنێویاندا دەگمەنە.»(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣٠٩) ئەمە جگە لەوەی سوودێکی زۆر گەورەشیان بە دەوڵەت گەیاندووە لەڕێگەی ئەو باجە زۆرەی مەڕوماڵات کە پێویست بووە بیدەن. دوو بەڵگەنامەی عوسمانی کە دەگەڕێنەوە بۆ ساڵی(١٢٧٧ک/١٨٦١ز) ئەوە دەردەخەن کە باجی یەک ساڵی مەڕوماڵاتی عەشیرەتی جاف بریتی بووە لە سێ بار قورش(واتە ٣٠٠,٠٠٠ قورش)(A_}MKT_UM___00481_00069_001_001 ; A_{MKT_MHM__00226_00023_001_001). ئەم خێروبێرە زۆرەش هۆکارێکی گرنگ بووە بۆ ئەوەی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیی بەردەوام لە هەوڵی پەلکێشکردن و تەماحدان بن بە سەرکردەکانی عەشیرەتەکە و ناکۆک

بن لەسەر وابەستەیی ئەم عەشیرەتە.

دوای ئاژەڵداریی، بە پلەی دووەم کشتوکاڵ بەشێکی گرنگ بووە لە چالاکیی ئابووریی و هۆکارەکانی پژێوی خەڵکی قەزای گوڵعەنبەر. دانیشتووی گوندەکانی قەزاکە بەگشتی نیشتەجێ بوون و بە کشتوکاڵەوە سەرقاڵ بوون(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣٠٩ –٣١٠). لە نێوان تیرەکانی عەشیرەتی جافدا تیرەی یەزدانبەخشی بە پێچەوانەی تیرەکانی دیکەوە کۆچەریی نەبوون، بەڵکو لە گوندەکانی کەنار ڕووباری دیالە (سیروان) لە سنووری قەزای گوڵعەنبەر نیشتەجێ و بە کشتوکاڵ کردنەوە سەرقاڵبوون و لەسایەی کشتیارییەکەشیاندا بە خۆشیی ژیاون. هاوکات مەڕ و بزنیشیان بەخێو کردووە و لەگەڵ ئاژەڵی تیرەکانی تری جاف بەرەو لەوەڕگایان ناردوون(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل٢٢٥ –٢٢٦). جگە لەمان، ١٢٠٠ماڵی دیکەی جاف لە ڕێگای کشتوکاڵەوە ژیاون و لە گوندەکانی کەنار ڕووباری زڕباتییە و دیالە نیشتەجێ بوون(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل٢٢٦). لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بگوترێت کە سەرباری بوونی سەرچاوەی ئاویی زۆر و بەپیتی خاکی قەزاکە بۆ کشتوکاڵ، کەچی زۆربەی گوندەکان بەشێوەیەکی سنووردار کشتوکاڵیان کردووە و بەروبوومەکان هەر لە ناوخۆی قەزاکەدا بەکاربراوە. بەروبوومە کشتوکاڵییەکانیش بریتی بوون لە هەموو جۆرەکانی دانەوێڵە، پەموو و تووتن(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣٠٨).

هەردوو سێکتەری ئاژەڵداریی و کشتوکاڵی بەڕێژەیەکی باش خۆراکی سەرەکی دانیشتوانی ناوچەکەیان دەستەبەر کردووە. بۆ نموونە خواردنی سەرەکی عەشیرەتی جاف بریتی بووە لە: نانی گەنم و جۆ و ساوەر، لە شیری ئاژەڵیش پەنیر و ماست و کەشک. جگە لە سەرۆکەکانیان، ئەو جل و بەرگەی پۆشیویانە لەو قوماشانە بوو کە لە ناوخۆی ناوچەی سلێمانی دروستکراوە، هەروەک خۆیان فەرەنجییان لە خوریی دروستکردووە (ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل٢٢٨).

باسی دووەم/ بارودۆخی کارگێڕی قەزاکە

١ –ساڵنامەکانی دەوڵەتی عەلییەی عوسمانی(سالنامه دولت علیه عثمانیه؛ ١٣٠٦: ل٤٥٨ ؛ ١٣٠٧: ل٤٧٨ ؛ ١٣٠٨: ل٤٦٨–٤٦٩ ؛ ١٣٠٩: ل٤٩٤ –٤٩٥ ؛ ١٣١٠: ل٥٠٤ –٥٠٥ ؛ ١٣١١: ل٥٣٤ –٥٣٥ ؛ ١٣١٢: ل٥٥٠ –٥٥١ ؛ ١٣١٣: ل٥٨٢–٥٨٣ ؛ ١٣١٤: ل٥٩٤ –٥٩٥ ؛ ١٣١٥: ل٤١٤ ؛ ١٣١٦: ل٤٢٨ ؛ ١٣١٧: ل٤١٤ ؛ ١٣١٨: ل٤٦٠ ؛

١٣١٩: ل٥٠٨ ؛ ١٣٢٠: ل٥٣١ ؛ ١٣٢١: ل٥٨١ ؛ ١٣٢٢: ل٥٩٣ ؛ ١٣٢٣: ل٦٦١ ؛ ١٣٢٤: ل٧٢٥ ؛ ١٣٢٥: ل٧٢١ ؛ ١٣٢٦: ل٧٢٩ ؛ ١٣٢٧: ل٧٩٤ ؛ ١٣٢٨: ل٨٠٧ ؛ ١٣٣٣: ل٧٠٢)

سالْنامەكانی دەوڵەتی عەلییە یەکەمین و گشتگیرترین سالْنامەی عوسمانین، كە دوای ڕاگەیاندنی تەنزیمات یەکەم ژمارەی لەساڵی ١٨٤٧ دەرچووە. ئەم سالْنامەیە بەوە جیادەكرێتەوە، زانیاریی دەربارەی سەرجەم ویلایەت و ناوچەكانی دەوڵەتی عوسمانی لەخۆگرتووە و وەک سالْنامەی ویلایەتەكان تایبەت نییە بە یەک ناوچە. لەم چوارچێوەیەشدا گوڵعەنبەر وەک قەزایەكی سەر بە سەنجەقی سلێمانی تێیدا دەردەكەوێت. لە یەكەم ژمارەی ئەم سالْنامەیە (١٢٦٣ك/١٨٤٧ز) تاوەكو سالْنامەی (١٣٠٥ك/١٨٨٨)یش ناوی گوڵعەنبەر تەنها وەک قەزایەكی سەر بە سلێمانی هاتووە و هیچ وردەكارییەكی لەبارەوە باس نەكراوە، بەڵام لە سالْنامەی (١٣٠٦ك/١٨٨٩ز) بەدواوە لەپاڵ ناوەكەی وەک قەزایەک، هەندێ زانیارییش لەبارەیەوە خراوەتەڕوو، بەم شێوەی خوارەوە:

أ/ پۆستی قایمقام:

| سالْنامە | ناوی قایمقام | پلە |
| --- | --- | --- |
| ١٣٠٦ك/١٨٨٩ز | | |
| ١٣٠٧ك/١٨٩٠ز | بەتاڵ[٨] | |
| ١٣٠٨ك/١٨٩١ز | | |
| ١٣٠٩ك/١٨٩٢ز | عوسمان بەگ | |

٨ مەحمود پاشای جاف کە کوڕە گەورەی محەمەد پاشای جاف بووە، لەدوای کوژرانی باوکی(٩٩٢١ك/٠٨٨١ز) دەكرێتە قایمقامی قەزای گوڵعەنبەر، بەڵام بەهۆی ناكۆكییەكانییەوە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بەفەرمانێک لە پۆستی قایمقامێتی قەزای گوڵعەنبەر دووردەخرێتەوە و پلەی میری میرانی پێ دەدرێ و دەكرێ بە موتەسەڕیفی شاری ئورفە، لەبری ئەو عوسمان پاشای برای دەكرێت بە قایمقامی قەزای گوڵعەنبەر، بەڵام مەحمود پاشا ڕۆیشتن بۆ ئورفە ڕەتدەكاتەوە و پابەند نابێت بە بڕیارەكەوە، لەوە بەدوا بۆماوەی نزیكەی سێ ساڵ لە كێشە و ململانێدا دەبێ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و دوو ساڵیش لە ئەستەنبوڵ ئیقامە جەبری لەسەر دەسەپێنن، بەڵام دواتر بڕیاری لێبوردنی بۆ دەردەچێت و دەگەڕێتە و بۆ شارەزوور و ناو عەشیرەتەكەی. بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەوە بڕوانە: كەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: س.پ، ل٩٧١-٦٩١ حەسەن فەهمی بەگی جاف: س.پ، ل١٤-٦٥. سامان سەلاح: هەڵەبجە لە چەند بەڵگەنامەیەكی ئەرشیفی عوسمانیدا، گۆڤاری (خاڵ)، ژمارە(٢١)، ئابی ٧١٠٢، ل٣١١-٤١١.

| | | |
|---|---|---|
| ١٣١٠ك/١٨٩٢ز<br>١٣١١ك/١٨٩٣ز | عوسمان بەگ | بۆ پلەدوو بەرز کراوەتەوە |
| ١٣١٢ك/١٨٩٤ز<br>١٣١٣ك/١٨٩٥ز<br>١٣١٤ك/١٨٩٦ز<br>١٣١٥ك/١٨٩٧ز<br>١٣١٦ك/١٨٩٨ز<br>١٣١٧ك/١٨٩٩ز<br>١٣١٨ك/١٩٠٠ز<br>١٣١٩ك/١٩٠١ز<br>١٣٢٠ك/١٩٠٢ز<br>١٣٢١ك/١٩٠٣ز<br>١٣٢٢ك/١٩٠٤ز<br>١٣٢٣ك/١٩٠٥ز<br>١٣٢٤ك/١٩٠٦ز<br>١٣٢٥ك/١٩٠٧ز<br>١٣٢٦ك/١٩٠٨ز[٩] | عوسمان پاشا | بۆ میری میران بەرزکراوەتەوە |
| ١٣٢٧ڕۆمی/١٩١١ز<br>١٣٢٨ڕ/١٩١٢ز | مەجید ئەفەندی | میری میران |
| ١٣٣٣ڕ/١٩١٨ز | ئەمین بەگ | |

---

٩ عوسمان پاشای جاف هەتا مردنی لە تشرینی یەکەمی ٩٠٩١ قایمقامی قەزاکە بووە، لە دوای ئەویش هەتا ساڵی ٨١٩١ کە دەسەڵاتی تورکەکان لە ناوچەکە کۆتایی پێدێت ژمارەیەک قایمقامی تر بۆ قەزاکە دانراون. بۆ وردەکاری زیاتر لەمبارەوە بڕوانە: سامان سەڵاح: س.پ، ل٤١١-٦١١.

لێرەدا دوو بابەت جێگای سەرنج و هەڵوێستە لەسەرکردنە، یەکەمیان ئەو سێ ساڵەی کە ساڵنامەکە دیاریکردووە کە پۆستی قائیمقامی هەڵەبجە بەتاڵ بووە، ڕاستییەکەی ئەوەیە مەحمود پاشای جاف کە کوڕە گەورەی محەمەد پاشای جاف بووە، لەدوای کوژرانی باوکی(١٢٩٩ک/١٨٨٠ز) دەکرێتە قائیمقامی قەزای گوڵعەنبەر، بەڵام بەهۆی ناکۆکییەکانییەوە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بەفەرمانێکی سوڵتان عەبدولحەمید(١٨٨٨/١١/٢٢) لە پۆستی قائیمقامێتی قەزای گوڵعەنبەر دووردەخرێتەوە و پلەی میری میرانی پێ دەدرێت و دەکرێت بە موتەسەڕیفی شاری ئورفە، لەبری ئەو عوسمان پاشای برای دەکرێت بە قائیمقامی قەزای گوڵعەنبەر، بەڵام مەحمود پاشا ڕۆیشتن بۆ ئورفە ڕەتدەکاتەوە و پابەند نابێت بە بڕیارەکەوە، لەوە بەدوا بۆماوەی نزیکەی سێ ساڵ لە کێشە و ململانێدا دەبێ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و دوو ساڵیش لە ئیستەنبوڵ ئیقامە جەبری لەسەر دەسەپێنن، بەڵام دواتر بڕیاری لێبوردنی بۆ دەردەچێت و دەگەڕێتە و بۆ شارەزوور و ناو عەشیرەتەکەی. (جاف، ١٩٩٥: ل١٧٩-١٩٦ ؛ جاف، ١٩٩٩: ل٤١-٥٦ ؛ سەلاح، ٢٠١٧: ل١١٣-١١٤)

ئەوی دیکەشیان ئەوەیە، ساڵنامەکە ساڵی ١٩٠٨ وەکو کۆتا ساڵی قائیمقامی عوسمان پاشا دیاریکردووە، ڕاستییەکەی عوسمان پاشا هەتا مردنی (تشرینی یەکەمی ١٩٠٩) قائیمقامی قەزاکە بووە، دوای خۆشی مەجیدبەگی کوڕە گەورەی چەند مانگێک قائیمقامی شارەکە بووە، لە دوای مردنی مەجیدبەگ هەتا ساڵی ١٩١٨ کە دەسەڵاتی تورکەکان لە ناوچەکە کۆتایی پێدێت ژمارەیەک قائیمقامی دیکە بۆ قەزاکە دانراون. (سەلاح، ٢٠١٧: ل١١٤-١١٦)

ب/ پۆستی نوێنەر، کە ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قەزا و سەرۆکی دادگای بەرایی قەزا بووە:

| سالنامە | ناوی نوێنەر |
|---|---|
| ١٣٠٦ك/١٨٨٩<br>١٣٠٧ك/١٨٩٠ز | ئەحمەد نامی ئەفەندی |
| ١٣٠٨ك/١٨٩١ز<br>١٣٠٩ك/١٨٩٢ز<br>١٣١٠ك/١٨٩٢ز<br>١٣١١ك/١٨٩٣ز | مستەفا ئەفەندی |
| ١٣١٢ك/١٨٩٤ز<br>١٣١٣ك/١٨٩٥ز<br>١٣١٤ك/١٨٩٦ز | ئەحمەد سائیب ئەفەندی |
| ١٣١٥ك/١٨٩٧ز<br>١٣١٦ك/١٨٩٨ز<br>١٣١٧ك/١٨٩٩ز | ئەحمەد ئەفەندی |
| ١٣١٨ك/١٩٠٠ز<br>١٣١٩ك/١٩٠١ز<br>١٣٢٠ك/١٩٠٢ز | حاجی مەولود ئەفەندی |
| ١٣٢١ك/١٩٠٣ز<br>١٣٢٢ك/١٩٠٤ز<br>١٣٢٣ك/١٩٠٥ز | ئیسماعیل ئەفەندی |
| ١٣٢٤ك/١٩٠٦ز<br>١٣٢٥ك/١٩٠٧ز | ئەحمەد سائیب ئەفەندی |
| ١٣٢٦ك/١٩٠٨ز | ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی |
| ١٣٢٧ڕۆمی/١٩١١ز | ئەحمەد ئەفەندی |
| ١٣٢٨ڕ/١٩١٢ز | عەبدولفەتاح ئەفەندی |
| ١٣٣٣ڕ/١٩١٨ز | دادوەر و سەرۆكی دادگای بەرایی مستەفا ڕەشید ئەفەندی |

**ج/ ناحیه و گوندەکانی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر:**

دیارە سەرەتای دروستبوونی قەزای گوڵعەنبەر، وەک قەزایەکی پلە نزم لە سیستمی کارگێڕیی دەوڵەتدا لە ڕیزی چینی سێیەمدا بووە، هەروەک لە ساڵی ١٣١٤ک/١٨٩٦ز وە پلەکەی بەرزدەکرێتەوە بۆ چینی دووەم. لە ساڵی ١٣٢٧ڕ/١٩١١ز ەوە بۆ چینی یەکەم بەرزکراوەتەوە. لە سەرجەم ساڵنامەکانی پێشووتردا لەجیاتی ناوی هەڵەبجە، ناوی گوڵعەنبەر وەک ناوەندی قەزاکە هاتووە کە هەر مەبەست لێی شارۆچکەی هەڵەبجەیە، بەڵام لەم ساڵنامەیە بەدواوە ناوی (ئەڵەبجە) وەک ناوەندی قەزای گوڵعەنبەر نووسراوە. هەر لە هەمان ساڵدا ناحیەی قزڵجە بۆ چینی دووەم و ناحیەی سرۆچک بۆ چینی سێیەم بەرزکراونەتەوە. وەک پێشتر ئاماژەی پێدرا، ساڵنامەکانی دەوڵەتی عەلییە، جیاواز لە ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵ و بەغدا، (قەرەداغ)یان بە ناحیەیەکی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر تۆمارکردووە بەم شێوەی خوارەوە:

| یەکەی کارگێڕیی | ژمارەی گوند |
| --- | --- |
| ناوەندی گوڵعەنبەر | ١٠٣ |
| ناحیەی سرۆچک | ٩٠ |
| تاقمی شێخ ئیسماعیل | ١ |
| ناحیەی قزڵجە | ١٠٦ |
| ناحیەی قەرەداغ | ١٧٣ |
| سەرجەم: ٣ ناحیە ، ٤٧٣ گوند | |

جگە لە هەردوو ساڵنامەی(١٣٢٧ڕۆمی/١٩١١ز) و (١٣٢٨ڕۆمی/١٩١٢ز) نەبێت، کە ناوی ناحیەی قەرەداغ و گوندەکەی تاقمی شێخ ئیسماعیلیان لاداوە و گوندەکانیان خستووەتە سەر شارۆچکەی ئەڵەبجە، بەم شێوەی خوارەوە:

| یەکەی کارگێڕیی | ژمارەی گوند |
| --- | --- |
| ناوەندی قەزا، ئەڵەبجە | ٢٧٦ |
| ناحیەی سرووۆچک | ٩٠ |
| ناحیەی قزڵجە | ١٠٦ |
| سەرجەم: ٢ ناحیە ، ٤٧٢ گوند | |

٢ - ساڵنامەی (١٢٩٢ک/١٨٧٥ز)ی ویلایەتی بەغدا(بڕوانە: ساڵنامەی ویلایەتی بەغدا ١٢٩٢، ل١٠٠ ):

| | |
|---|---|
| قائیمقام | محەمەد ساڵح بەگ |
| نوێنەر | عبدالسلام ئەفەندی |
| بەڕێوەبەری دارایی | سەعید ئەفەندی |
| بەڕێوەبەری نووسراوەکان | محەمەد ئەفەندی |
| ئەنجومەنی کارگێڕیی | سەرۆک(قایمقام) |
| ئەندامانی ئاسایی | نوێنەر، بەڕێوەبەری دارایی، نووسەری نووسراوەکان |
| ئەندامانی هەڵبژێردراو | عەلی بەگ، سەید ئەحمەد ئەفەندی، شێخ عەبدولڕەحمان ئەفەندی، شێخ حەسەن ئەفەندی |
| ئەنجومەنی سکاڵا(دادگا): | سەرۆک(نوێنەر) |
| پێداهەڵچووەوە | شێخ محەمەد ئەفەندی، عەبدوڵڵا بەگ، شێخ محەمەد ئەفەندی |
| نووسەر | فەتاح ئەفەندی |
| ئەمینی سندوقی قەزا | مەعروف ئەفەندی |
| فەرمانبەرانی تر | فەرمانبەری باجەکانی گوڵعەنبەر(حوسێن ئاغا)، فەرمانبەری باجەکانی پێنجوێن (ڕەزا ئەفەندی). |
| بەڕێوەبەری ناحیەکان | ناحیەی قزڵجە / ناحیەی سرۆچک |

٣- ساڵنامەی(١٣٠٨ک/١٨٩١ز)ی ویلایەتی موسڵ(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٠٨، ل١٥٢ -١٥٣):

| | |
|---|---|
| قائیمقام | عوسمان بەگ، ٤ نیشانەی مەجیدی |
| نوێنەر | ئەحمەد نامی ئەفەندی |
| بەڕێوەبەری دارایی | عەبدوڵڵا صدقی بەگ |
| نووسەری نووسراوەکان | سەلیم ئەفەندی |
| ئەندامانی ئەنجومەنی کارگێڕیی | ئەندامان: سەید ئەحمەد ئەفەندی، ساڵح ئاغا، ساڵح ئاغایەکی تر، بەتاڵ |

| | |
|---|---|
| دادگای بەرایی | سەرۆک(ئەحمەد نامی ئەفەندی) ، ئەندامان(ئەمین بەگ، شێخ سەعید ئەفەندی)، یاردەدەری لێپێچەرەوە(ئەحمەد بەگ)، نووسەری یەکەم(دەروێش ئەفەندی)، نووسەری دووەم(سلێمان بەگ) |
| فەرمانبەرانی تر | فەرمانبەری ئاسایش(مولازمی دووەم ئەحمەد ئەفەندی) / فەرمانبەری نفوس(خاڵس ئەفەندی) / نووسەری نفوس(ئەحمەد ئەفەندی). |
| ناحیەکانی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر | سرۆچک: بەڕێوەبەر(ئەحمەد ئەفەندی) / نووسەر(عەلی ئەفەندی).<br><br>قزڵجە: بەڕێوەبەر(یوسف ئەفەندی) / نووسەر(فەرەج ئەفەندی). |

٤ – ساڵنامەی(١٣١٠ک/١٨٩٢ز)ی ویلایەتی موسڵ(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠، ل٢١٥ –٢١٦ ):

| | |
|---|---|
| قائیمقام | عوسمان بەگ، ٤ نیشانەی مەجیدی |
| نوێنەر | مستەفا ئەفەندی |
| بەڕێوەبەری دارایی | عەبدوڵڵا سدقی ئەفەندی |
| نووسەری نووسراوەکان | سەعید ئەفەندی |
| ئەندامانی ئەنجومەنی کارگێڕیی قەزا | ئەندامانی ئاسایی(نوێنەر، بەڕێوەبەری دارایی، نووسەری نووسراوەکان) / ئەندامانی هەڵبژێردراو(سەید ئەحمەد ئەفەندی، ساڵح ئاغا، ساڵح ئاغایەکی تر، بەتاڵ). |
| دادگای بەرایی | سەرۆک(مستەفا ئەفەندی) / سەرنووسەر(دەروێش ئەفەندی) / ئەندام(شێخ سەعید ئەفەندی، شێخ محەمەد ئەفەندی) / لێپێچەرەوە(سلێمان بەگ) / نووسەری دووەم(ڕەشید ئەفەندی). |

| | |
|---|---|
| فەرمانبەرانی تر | فەرمانبەری ئاسایش(ئەحمەد ئەفەندی) / فەرمانبەری نفوس(خاڵس ئەفەندی) / نووسەری نفوس(عەبدولڕەحمان بەگ) / نووسەری تاپۆ(ڕۆستەم سرِی ئەفەندی). |
| ناحیەکانی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر | قزڵجە: بەڕێوەبەر(عەبدولکەریم ئاغا) / نووسەر(فەرەج ئەفەندی).<br><br>سرۆچک: بەڕێوەبەر(ئەحمەد ئاغا) / نووسەر(محەمەد ئەفەندی). |

٥ – ساڵنامەی(١٣١٢ک/١٨٩٤ز)ی ویلایەتی موسڵ(بڕوانە: ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢، ل١٨٤– ١٨٥):

| | |
|---|---|
| قائیمقام | عوسمان بەگ، ٤ نیشانەی مەجیدی |
| نوێنەر | ئەحمەد سائیب ئەفەندی |
| بەڕێوەبەری دارایی | مستەفا بەگ |
| نووسەری نووسراوەکان | سەعید ئەفەندی |
| ئەندامانی ئەنجومەنی کارگێڕیی قەزا | سەرۆکی ئەنجومەن(قائیمقام) / ئەندامانی ئاسایی(نوێنەر، بەڕێوەبەری دارایی، نووسەری نووسراوەکان) / ئەندامانی هەڵبژێردراو(سەید ئەحمەد ئەفەندی، ساڵح ئاغا، ساڵح، بەتاڵ). |
| دادگای بەرایی | سەرۆک(نوێنەر) / سەرنووسەر(محەمەد نوری ئەفەندی) / لێپێچەرەوە(سلێمان بەگ) / ئەندامان(ئەمین ئەفەندی، شێخ مەحمود ئەفەندی) / نووسەری دووەم(عەبدولکەریم ئەفەندی). |
| فەرمانبەرانی تر | فەرمانبەری نفوس(خاڵس ئەفەندی) / نووسەری نفوس(عەبدولڕەحمان بەگ) / نووسەری تاپۆ(ڕۆستەم ئەفەندی) / ئەمینداری سندوق(عەبدولکەریم ئەفەندی) / فەرمانبەری ئاسایش(ئەحمەد ئەفەندی). |

| | |
|---|---|
| ناحیەکانی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر | قزڵجە: بەڕێوەبەر(کەریم ئاغا) / نووسەر(عارف ئەفەندی) / فەرمانبەری رسوماتی پێنجوێن(ئیسماعیل حەقی ئەفەندی).<br>سرۆچک: بەڕێوەبەر(ئەحمەد ئاغا) / نووسەر(سەعید ئەفەندی). |

٦ - لە ساڵنامەی(١٣٢٥ک/١٩٠٧ز)ی ویلایەتی موسڵ(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥، ل ٢٢٩ ):

| | |
|---|---|
| قائیمقام | عوسمان پاشا، میری میران، ٣ نیشانەی عوسمانی و ٣ مەجیدی، مەدالیەی زیویی شانازیی) |
| نوێنەر | ئەحمەد سائیب ئەفەندی |
| بەڕێوەبەری دارایی | محەمەد شەریف ئەفەندی |
| نووسەری نووسراوەکان | محەمەد سەعید ئەفەندی |
| فەرمانگەی نفوس | فەرمانبەر(خالس ئەفەندی) / نووسەر (عەبدولڕەحمان ئەفەندی). |
| دادگای بەرایی | سەرنووسەر(سلێمان بەگ) / یاریدەدەری لێپێچەرەوە(ڕەشید ئەفەندی) / نووسەری دووەم(عەبدولکەریم ئەفەندی) |
| فەرمانبەرانی تر | بەڕێوەبەری تەلەگراف(ئەمین ئەفەندی) / نووسەری تاپۆ (سلێمان بەگ) |
| ناحیەکانی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر | قزڵجە: بەڕێوەبەر(سەدیق ئەفەندی) / نووسەر(محەمەد عەلی ئەفەندی).<br>سرۆچک: بەڕێوەبەر(بەتاڵ) / نووسەر(سەعید ئەفەندی). |

٧ – ساڵنامەی(١٣٣٠ک/١٩١٢ز)ی ویلایەتی موسڵ(ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠، ل٣٠٦ –٣٠٧ ):

| | |
|---|---|
| قائیمقام | عەبدولمەجید ئەفەندی |
| نوێنەر | ئەحمەد ئەفەندی |
| بەڕێوەبەری دارایی | عەبدولصەمەد ئەفەندی |
| موفتی | – |
| نووسەری نووسراوەکان | محەمەد سەعید ئەفەندی |
| ناحیەکانی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر | سەرۆکی ئەنجومەن(قائیمقام) / ئەندامانی ئاسایی(نوێنەر، موفتی، بەڕێوەبەری دارایی، نووسەری نووسراوەکان). |
| دادگاکانی قەزاکە | ١ـ-دادگای شەرعی: سەرۆک(نوێنەر ئەحمەد ئەفەندی) / سەرنووسەر(سەید هادی ئەفەندی) / نووسەری دووەم(شێخ محێدین ئەفەندی).<br>٢ـ-دادگای بەرایی: سەرۆک(نوێنەر ئەحمەد ئەفەندی)/ ئەندامان (مەحمود ئەفەندی، محەمەدئەمین ئەفەندی)/ سەرنووسەر(سلێمان ئەفەندی)/ یاریدەدەری لێپێچەرەوە(دەروێش ئەفەندی). |
| خامەی دارایی | بەڕێوەبەری دارایی(عەبدولصەمەد ئەفەندی، پلەسێ)/ ئەمینداری سندوق(ئەحمەد ئەفەندی) / فەرمانبەری باجگر. |
| خامەی نفوس | فەرمانبەر(محەمەد خاڵس ئەفەندی) / نووسەر (عەبدولڕەحمان ئەفەندی). |
| فەرمانبەرانی تر | بەڕێوەبەری تەلەگراف / نووسەری تاپۆ(سلێمان زەوقی ئەفەندی). |
| ناحیەکانی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر | قزڵجە: بەڕێوەبەر(حەسەن ئەفەندی) / نووسەر (عەبدولڕەحمان ئەفەندی).<br>سرۆچک: بەڕێوەبەر(ئەحمەدبەگ) / نووسەر(سەعید ئەفەندی). |

## ئەنجام

١ـ هەڵکەوتەی جوگرافی قەزای گوڵعەنبەر کە هاوسنووری ئێران بووە لە لایەک و، لە لایەکی ترەوە گیرسانەوە و نیشتەجێبوونی بەشێکی عەشیرەتی جاف لە سنووری ئەو قەزایەدا، وایکردبوو کە دەوڵەتی عوسمانی گرنگی زۆر بە قەزاکە بدات، ئەوەش لە ساڵنامەکاندا بەڕوونی ڕەنگیداوەتەوە.

٢ـ بەشێکی کەمی عەشیرەتەکە لە ناو سەنتەری قەزاکە و گوندەکانی دەوروبەریدا نیشتەجێ ببوون و سەرقاڵی کشتوکاڵ کردن بوون، ئەوانی دیکەیان بەدوای لەوەڕگادا ساڵانە بەپێی وەرزەکان لە نێوان قزرابات و کوڵەجۆ و کوێستانەکانی مەریوان و سنەدا گەرمیان و کوێستانیان کردووە، دەوڵەتی عوسمانی بۆ بابەتی باج ساڵانە ئاماری وردی سامانی ئاژەڵی تیرە و تائیفەکانی عەشیرەتی جافی وەرگرتووە، لەو ڕێگەیەوە ساڵانە باجێکی زۆری دەستکەوتووە.

٣ـ گەورەیی عەشیرەتەکە و سنوور بەزاندنەکانی و ئەو باجە زۆرەی کە ساڵانە ئەم عەشیرەتە دەیاندا، وایکردبوو کە هەمیشە دەوڵەتەکانی عوسمانی و ئێران هەوڵی ڕاکێشان و پەلکێشکردنیان بدەن بۆ ناو سنووری قەڵەمڕەوی خۆیان.

٤ـ سەبارەت بە لایەنی کارگێڕی قەزاکە، ساڵنامەکان زانیاری کەمیان لەوبارەوە گواستووەتەوە، ئەوان تەنها ئاماژەیان بەناوی کاربەدەست و لێپرسراوەکانی قەزاکە و ناحیەکان و ژمارەی گوندەکانیان کردووە، بەبێ چوونە ناو وردەکاری بابەتەکان، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ئەتوانین لەڕێگە ئەو کەمە زانیارییەوە ئاگاداری ژمارەی فەرمانگەکان و لێپرسراوە ئیدارییەکانیان و ئەو گۆڕانکارییانە ببن کە لە ساڵنامەیەک بۆ ساڵنامەیەکی تر لە پۆستەکاندا ڕوویانداوە.

## سەرچاوەکان


یەکەم/ ساڵنامە عوسمانییەکان (بە زمانی تورکی عوسمانی)

- سالنامە ویلایت موصل:
- ـ ١٣٠٨هـ ، موصل ولایتی مطبعە سندە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣١٠هـ موصل ولایتی مطبعە سندە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣١٢هـ ، موصل ولایتی مطبعە سندە باصلمشدر.
- ـ ١٣٢٥هـ ، مطبعە ویلایتدە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣٣٠هـ ، مطبعەسندە طبع اولمنمشدر، موصل.
- ساڵنامەی ویلایەتی بەغداد
- ـ (١٢٩٢هـ)، دفعە(١)، مطبعە ویلایت بغداد.
- سالنامە دولت علیە عثمانیە:
- ـ ١٣٠٦هـ ، مطبعە عامرە دە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣٠٧هـ ، مطبعە عامرە دە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣٠٨هـ ، مطبعە عامرە دە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣٠٩هـ ، مطبعە عامرە دە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣١٠هـ ، مطبعە عامرە دە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣١١هـ ، مطبعە عامرە دە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣١٢هـ ، مطبعە عامرە دە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣١٣هـ ، مطبعە عامرە دە طبع اولنمشدر.
- ـ ١٣١٤هـ ، مطبعە عثمانیە.
- ـ ١٣١٥هـ ، عالم مطبعەسی.
- ـ ١٣١٦هـ ، محمودبک مطبعەسی.
- ـ ١٣١٧هـ ، مطبعە عامرە.
- ـ ١٣١٨هـ ، محمودبک و سرویچە مطبعەلری.
- ـ ١٣١٩هـ ، طاهربک مطبعەسی.
- ـ ١٣٢٠هـ ، دار الطباعە العامرە.
- ـ ١٣٢١هـ ، عالم مطبعەسی.
- ـ ١٣٢٢هـ ، مطبعە احمد احسان وشرکاسی.
- ـ ١٣٢٣هـ ، مطبعە احمد احسان.
- ـ ١٣٢٤هـ ، مطبعە احمد احسان..
- ـ ١٣٢٥هـ ، مطبعە احمد احسان.
- ـ ١٣٢٦سنە هیجریە سنە مخصوص، مطبعە احمد احسان.
- ـ ١٣٢٦ سنە مالیە، سلانیک مطبعەسی.

ـ ١٣٢٧هـ ، سلانيك مطبعه سى.
ـ ١٣٢٨هـ ، سلانيك مطبعه سى.
ـ ١٣٣٣-١٣٣٤هـ ، هلال مطبعەسى – باب عالى قارشوسنده.
دووەم/ بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی عوسمانی
.A_}MKT_UM_00249_00038_001_001
.I_DH_00499_033949_003_001
.A_}MKT_UM___00481_00069_001_001
.A_}MKT_MHM__00226_00023_001_001
سێیەم/ کتێب/ کوردی:
ـ عادل صدیق عەلی، ٢٠٢٠، هەڵەبجە شارێکی بچووک و مێژوویەکی دەوڵەمەند، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ناوەندی ڕێنوێن.
ـ عەلی، ئارام مەجید، ٢٠١٤، چەردەیەک لە مێژووی عەشیرەتی شەمێران، چاپی یەکەم، سلێمان.
ـ فەهمی بەگی جاف، حەسەن، ١٩٩٩، مێژووی هۆزی جاف و مەحمود پاشای جاف، چاپخانەی دێکان.
ـ سامی، شەمسەدین، ٢٠٠٨، کورد و کوردستان لە یەکەم ئەنسیکلۆپیدیای تورکی مێژوودا، و.ئەحمەد تاقانە، چاپی یەکەم، هەولێر.
ـ فەتاح بەگی جاف، کەریم بەگی، ١٩٩٥، تەئریخی جاف، لێکۆڵینەوەی د.حەسەن جاف، بەغدا.
عەرەبی:
ـ الحمیداوی، م.م بان راوی شلتاغ:، ٢٠٠٩، التقسیمات الاداریة لسنجق السلیمانیة خلال العهد العثماني الاخیر(١٨٦٩-١٩١٨)، مجلة القادسیة،العدد(٣).
ـ علاءالدین، عطا محمد، ٢٠٠٨، قضاء هەڵەبجه، من منشورات مركز الدراسات الكردیة (كوردۆلۆجی)، طبعة الاولی.
تورکی:
Abdulrazaq ,Mujahed Azeez 2021, “H.985 (M.1577) tarihli KK 102 nolu deftere göre Hille Livası” Ankara Üniversitesi, Yayınlanmamış .Yüksek Lisans Tezi
Eroğlu vd, Cengiz, Kasım 2012, Osmanlı Vilayet Salnamelerinde .Musul, ORSAM, Ankara
چوارەم/ گۆڤار/ کوردی:
ـ جاف، محەمەد سەعید، ١٩٩٤، هەڵوێستێکی جوامێرانە، گۆڤاری(ڕەنگین)، ژ(٦٨).
ـ سەلاح، سامان ، ئابی ٢٠١٧، هەڵەبجە لە چەند بەڵگەنامەیەکی ئەرشیڤی عوسمانیدا، گۆڤاری خاڵ، ژ(١٢).
ـ کۆچ، حەسەن، ئابی، ٢٠٢٠مەڵبەندەکانی بەڕێوەبردنی شارەزوور لە سەردەمی عوسمانیدا: قەڵاکانی زەڵم و گوڵعەنبەر، وەرگێڕ: کامەران کوردەوار، گۆڤاری خاڵ، ژ (٢٩).


